# ( ٢٠ ) بەڵگەی صحیح بۆ لەبەرکردن سەبارت بە ( ١٥ ) بابەتی زۆر گرینگ

| | |
|---|---|
| ١ هاوارکردنە غەیری خوا | ٢ وێنەگرتن |
| ٣ سەربڕین بۆ غەیری خوا | ٤ حیزبایەتی |
| ٥ بە کافر دانانی موسڵمانان | ٦ ڕیش تاشین |
| ٧ تەوەسول کردن بە مردوان | ٨ دەلینگ درێژی |
| ٩ سوێند خواردن بە غەیری خوا | ١٠ بیدعە لە دیندا |
| ١١ چوونە لای ساحیری و جادوگەر | ١٢ گۆرانی و مۆسیقا |
| ١٣ سەفەر بۆ لای قەبری پێغەمبەران و پیاوچاکان | ١٤ نوشتە هەڵواسین |
| ١٥ دەرچون لە کۆمەڵی موسڵمانان و گوێ ڕایەڵی کاربەدەستان لە چاکەدا | |

ئامادەکردنی
م. هەڵگۆرد مصطفی گەلاڵەیی

## بەڵگە لەسەر حەڕامیەتی پاڕانەوە و هانا بردن بۆ غەیری خوا

١-قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ ٦ ﴾ **الأحقاف: ٥ – ٦.**

**واتە: کێ لەوکەسە گومڕا ترە کە هاوار دەکاتە غەیری خواو لێی دەپاڕێتەوە لەکاتێکدا وەڵامی ناداتەوە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە، ئەوان لە پاڕانەوەو داواکاریەکانیان بێ ئاگان، وە کاتێك خەڵکی کۆ کرایەوە بۆ لێپرسینەوە لێیان دەبن بە دوژمن و بەو عیبادەتانەش بێ باوەڕ دەبن کەبۆیان کراوە.**

٢-قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ١٨ ﴾ ﴿**الجن: ١٨**﴾.

**واتە: مزگەوتەکان ماڵی خوان، لەگەڵ خوادا هاوارو هانا بۆ کەسی تر مەبەن.**

## بەڵگە لەسەر حەڕامیەتی قوربانی و سەربڕین بۆ غەیری خوای گەورە

٣- قَالَ رسول الله ﷺ « لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَى مُحْدِثًا وَلَعَنَ اللَّهُ مَنْ غَيَّرَ مَنَارَ الأَرْضِ ». **صحيح مسلم: ٥٢٣٩.**

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: لەعنەتی خوا لەو کەسەی لەعنەت لەدایك وباوکی خۆی دەکات، وە لەعنەتی خوا لەو کەسەی شتێك سەر ببڕێت بۆ غەیری خوای گەورە، وە لەعنەتی خوا لەو کەسەی تاوانبارێك یا بیدعەچیەك بپارێزێت و بەرگری لێبکات بۆ ئەوەی حوکمی شەرعی بەسەدا جێ بەجێنەکرێت، وە لە عنەتی خوا لەوکەسەی سنووری نێوان زەوییەکان دەگۆڕێت.**

## حەڕامیەتی نووشتە هەڵواسین

٤- قال رسول الله ﷺ: " من علّق تميمةً فقد أشرك ". **"السلسلة الصحيحة" ٤٩٢.**

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك (نوشتەیەك یان مۆریەك یان پەڕۆیەك یان هەرشتێکی تر بە مەبەستی شیفاو پارێزگاری) هەڵبواسێت ئەوە بە تەئکید شەریکی بۆ خوای گەورە داناوە.**

٥- قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ «إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ» ( الصحيحة ) ٢٩٧٢ .

واته : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : بە تەئکید داواکردنی روقیەی ناشەرعی ( وەکو داواکردن لە جنۆکەو شەیاتینەکانەوەو پەنا گرتن پێیانەوە ) ، وە گشت شتێکی هەڵواسراو بە مەبەستی چاوەزار و شیفا لە نوشتەو پەرۆ و دارو بەرد و مۆری و ناڵی گوێدرێژ و وە ئەو نوشت و سیحرەی ئافرەت پیاوەکەی یان پیاوان خۆشەویستراو دەکات ( یان هرجۆرە نوشت وسیحرێکی تر ) ، هەر یەك لەم سێ شتانەی باسکران (الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ) شەریك بۆ خوا بڕیاردانە.

**حەرامیەتی تایبەت کردنی زیارەت بۆمەزارگاکانی پێغەمبەران و پیاوچاکان بەمەبەستی عیبادەت**

٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ ﷺ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى. صحيح البخاري : ١١٨٩ ، ومسلم : ٣٤٥٠.

واته : لە ئەبو هورریرەوە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی : سەفەرو زیارەت بە مەبەستی عیبادەت ڕێك ناخرێت بۆ هیچ شوێنێك تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت ، مزگەوتی حەڕام لە مەککەی پیرۆز و مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینە و مزگەوتی ئەقسا لە فەلەستین .

**حەڕامیەتی چوونە لای ساحیر و فاڵچی و قەشەو ئەستێرە ناسەکان و شوێن هەڵگران**

٧- عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ « مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً » . صحيح مسلم : ٥٩٥٧.

واته : هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەر کەسێك بچێتە لای شوێن هەڵگرێك پرسیاری شتێکی لێبکات ئەوا چل شەو هیچ نوێژێکی لێ قەبوڵ ناکرێت .

٨- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ، قَالَ: «مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ». ( صحيح ) انظر حديث رقم : ٥٩٣٩ في صحيح الجامع.

**واته : له ئەبو هوریرەوە( ڕەزای خوای گەورەی لێبێت ) فەرمووی ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك بچێتە لای شوێن هەڵگرێك ( بۆ پرسیارکردنی شتێکی بزر بووی ) یان بچێتە لای کاهینێك ( قەشەیەك ) بۆ نوشتەیەکی سحر ، ئینجا باوەڕی پێبکات بەوەی دەیڵێت ، ئەوە بە تەئکید بێ باوەڕ بووە بەو قورئانەی بە سەر محمد ﷺ دابەزیوە .**

**حەرامیەتی تەوسل کردن بە مردووان لە پێغەمبەران و پیاوچاکان**

٩- عَنْ أَنَسٍ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ، رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ ، كَانَ إِذَا قَحطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ، فَقَالَ : اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا قَالَ فَيُسْقَوْنَ. صحيح الباري : ١٠١٠ .

**واته :لەئەنەسەوە فەرمووی خەڵکی ( لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ) هەرکاتێك بارانیان بۆ نەبارییایەو ووشکەساڵی ڕووی تێکردبان ، عومەری کوڕی خەتاب دەچووە لای عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و داوای لێدەکرد دوعای باران بارینیان بۆ بکات ، ئیمامی عومەر ڕەزای خوای گەورەی لێبێت دەیفەرموو : خوایە ئێمە تەوسولمان بە دوعای پێغەمبەر ﷺ دەکرد بۆ ئەوەی بارا نمان بۆ ببارێنیت ، ( بەڵام ئێستا پێغەمبەری خوا لە ژیاندا نەماوە ) بۆیە تەووسول دەکەین بە دوعای مامی پێغەمبەر ﷺ تۆش بارا نمان بۆ ببارێنە ، ئینجا خوای گەورە وەڵامی دەدانەوەو بارانی بۆ دەباراندن .**

**ـ مانای قسەکەی ئیمامی عومەر کە دەیفەرموو** (اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا قَالَ فَيُسْقَوْنَ) **. واته : خوایە ئێمە لە کاتی باران نەبارینددا دەچووینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی لەژیاندا مابوو داوامان لێدەکرد دوعامان بۆ بکات ، بە دوعای پێغەمبەر ﷺ خۆمان لە خوای گەورە نزیك دەکردەوە ، بەڵام ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا نەماوە ، مومکین نیە بگەڕێتەوە ناومان و دوعامان بۆ**

بکات بۆیە ئێستا دەچینە لای عەباسی مامی پێغەمبەرمان ﷺ و داوای لێدەکەین دوعای باران بارینمان بۆ بکات ، بە مانای ئەوە نایەت کە سەحابە بەڕێزەکان لە کاتی دوعاکردنیان بیانفەرمووبێت (اللهم بجاه نبیك اسقنا) نەیانفەرمووە خوایە بۆ خاتری ڕێز و مەکانەتی پێغەمبەرەکەت بارا نمان بۆ ببارێنە ، پاشان لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ بیانفەرمووبێت : (اللهم بجاه العباس اسقنا) واتە : خوایە بۆ خاتری ڕێز و مەکانەتی عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ بارنمان بۆ ببارێنە ، بە هیچ جۆرێك بەم شێوەیە تەوەسولیان نەکردووە ، چونکەداواکردن بەم شێوەیە بیدعەیەو هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی شەرعی بۆ نیە کە لە قورئان وسوننەتەوە هاتبێت ، بێگومان هیچ کەسێکیش لە پێشینە چاکەکان ئەم کارەیان نەکردووە .

## حەڕامیەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

١٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أَشْرَكَ» .ارواء الغليل: (٢٥٦١).

واتە : لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە ﵄ فەرمووی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو : هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوە کوفری کردووە یان شەریکی بۆ خوا داناوە .

## حەڕامیەتی بیدعە لە دیندا

١١- عَنْ عَائِشَةَ ، رَضِىَ اللَّهُ عَنْهَا ، قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ . البخاري : ٢٦٩٧ ، ومسلم : ٤٥٨٩.

واتە: لە عائیشە دایکی باوەڕدارانەوە ( ڕەزای خوای گەورەی لێبێت ) فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك شتێك لە دینی ئێمەدا دا بهێنێ لە کاتێکدا ئەم شتە داهێنراوە لە دیندا نەبوو ئەوە ڕەدکراوەیە و قەبول کراو نیە .

١٢- قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ . ((الصحيحة)) (٩٣٧ و ٣٠٠٧) .

**واته : ووشيار بن له گشت شتێكی تازەو نوێ له ديندا (كەبەڵگەی لەسەر نەبێت) ، چونكه هەموو شتێكی تازەو نوێ كه له ديندا داهێنراوو بيدعەيه ، وەگشت بيدعەيەكيش له ديندا گومڕاييه .**

## حەڕاميەتی حيزبايەتی

١٣-قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾**الروم:٣١-٣٢** .

**واته: موسوڵمانان له موشريكان مەبن و لاساييان مەكەنەوە ، ئەوانەی ئايينەكەيان پارچە پارچە كرد و بوون بە چەند حيزب و بەشێك ، بەڕاستی هەموو حيزبێك تەنها بەوە دڵخۆشە كە خۆی لەسەريەتی و پەيڕەوی دەكات .**

## حەڕاميەتی بەكافر دانانی مـوسـوڵـمانـان

١٤- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ : أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِرُ فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا.**صحيح البخاري : ٦١٠٤** .

**واته: له عبدالله ی كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای گەورەيان لێبێت) فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر پياوێك بە براكەی بڵێت (كافر) بە تەئكيد يەكێكيان بەم كافر بوونە دەگەڕێتەوەو كافر دەبێت .**

## دەرچوون لە کۆمەڵی موسوڵمان و گوێڕایەڵی کاربەدەستان لە چاکەدا

١٥- عن أَبِي رَجَاءٍ الْعُطَارِدِيُّ قَالَ : سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا فَمَاتَ إِلاَّ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. **صحيح البخاري: ٧٠٥٤ .ومسلم : ٤٨٩٦.**

**واتە: لە باوکی ڕەجائی عوتاریدی ووتی : گوێم لە ئیبن عباس بوو (ڕەزای خوای گەورەیان لێبێت) فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەر کەسێك شتێکی (خراپی) لە پێشەواکەی بینی و پێی ناخۆش بوو ئەوە با ئارامی لەسەر بگرێت و (لێی دەرنەچێت) ، بەڕاستی هەر کەسێك بەئەندازەی بستێك لە جەماعەتی موسوڵمانان جیابێتەوە و بەم شێوەیە بمرێت ، ئەوە وەکو کەسانی سەردەمی نەفامی مردووە (هەر وەکو چۆن نەفامەکانی پێش ئیسلام بەبێ پێشەوا و پارچە پارچە بوون و بەم شێوەیە مردوون بەهەمان شێوە هەر کەسێك پێشەوای موسوڵمان بە پێشەواو وەلی ئەمری خۆی نەزانێت وەکو ئەوان دەمرێت) .**

## ریش تاشین

١٦- عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ« أَحْفُوا الشَّوَارِبَ وَأَعْفُوا اللِّحَى»**صحيح مسلم: ٦٢٣ .**

**واتە : لە نافیعەوە لە ئیبن عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : موسوڵمانان سمێڵتان کورت بکەنەوە و ڕیشتان بەربدەنەوە .**

## حەرامیەتی گۆرانی و مۆسیقا

١٧-قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ ﴾ **﴿لقمان: ٦﴾** .

**واتە : هەندێك لە خەڵکی هەن قسەی بێ خێر و بێ مانا دەکڕن (وەك گۆرانی و مۆسیقا) بۆ ئەوەی خۆی و کەسانی تریش لە ڕێبازی خوای گەورە گومڕا بکات ، بێ ئەوەی هەست بکا بە**

مەترسی كارەكەی و بزانێت چ كەتنێك دەكات بەخۆی و خەڵكی ، ئەو شتە بێ كەڵك و بێ نرخانە دەكرێت بۆ ئەوەی گاڵتە بە پەیام و رێبازی خوا بكات ، ئا ئەوانە سزا و تۆڵەیەكی ریسوا كەر و ئابرووبەر چاوەرێیانە .

**١٨- قَالَ رسولُ اللهِ ﷺ: لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ . صحيح البخاري : ٥٥٩٠ .**

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : كەسانێك لە ئوممەتەكەم پەیدا دەبن زینا و حەریر و ئارەق و ئالەتە مۆسیقیەكان حەڵاڵ دەكەن .

## حەرامیەتی درێژكردنەوەی دەلینگ بۆ پیاوان

**١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ : مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفِي النَّارِ.صحيح البخاري: ٥٧٨٧ .**

واتە : لەئەبی هورەیرەوە ( رەزای خوای گەورەی لێبێت ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی : هەر دەلینگێك لەخوار گوێزینگ بێ لە ئاگردایە .

## (( حەرامیەتی وێنەگرتن و وێنەكێشان ))

**٢٠- قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ«أَشَدُّ النَّاسِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُصَوِّرُونَ». صحيح مسلم : ٥٦٦١.**

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : بەئێش ترین سزا لە رۆژی دواییدا بۆ ئەو كەسانەیە كە وێنەگر و وێنەكێشن .